# ئەركی سەرشانمان

# لە بەرامبەر هێرشی عەلمانیەت ولیبرالیەت دا چییە ؟

**نووسینی: شێخی فەرمووده‌ناس عبدالعزیز الطریفی**

**و: دانا شافیعی**



گزنگی هیوابەخشی خۆری تەمكینە

www.Gizing.net

www.Facebook.com/Gizing.net

١٤٣٨ – ٢٠١٦

**ئاگاداری ئەو هێرشە سەرسەختن؛ کە عەلمانی ولیبرالیەکان خەریکن بۆ سەر پێکهاتە جێگیر ونەگۆڕەکانی ئوممەتی دەبەن. ئەرکی سەر شانی موسوڵمانان لە بەرامبەر ئەو خەڵکەدا چییە ؟**

**عەلمانیەت ڕووەکێکی ڕۆژئاواییەو، سەرەتا وەکو سەرکێشییەك لە ڕووی کڵێسای هەڵگێڕدراو وتەحریف کراودا دروست بوو. کڵێسا هەوڵی دابوو سازانێك لە نێوان ئاین ولاهوت وزانستدا دروستکا، بەڵام شکستی هێناو وترسی لە شۆڕش وناڕەزایەتی خەڵك هەبوو، بۆیە پەنای بردە بەر فیکری یۆنان وفەلسەفەی ئەرستۆ، بەو هیوایەی فریایان کەوێت وڕزگاریانکا، لەو بەینەدا فەلسەفەیەك بە ناوی فەلسەفەی "سکولاستی — Scholasticism"ەوە دروستبوو.**

**مەسیحییەکان ئەم نوێکارییەیان بە پشت بەستن بە عەقڵ وبیرکردنەوەو وتێگەیشتنی میتافیزیکی ئەرستۆوە دروست کردو، هەوڵیاندا جێگای فەلسەفە لە ژێر چەتری لاهوت وئایندا بکەنەوەو، بە لای کەم بیانسازێنن. یەکێك لە پێشەنگ وپێشڕەوانی ئەم بیرۆکەیە "تۆمای ئەکوینی" بوو، ئەو پیاوە بە هەر چی شێواز وڕێگەچارەیەك بوو؛ زەحمەتی ئەوەی دەکێشا کە پەیوەستەیەك لە نێوان عەقڵ ودینە گۆڕاوەکەی کڵێسادا دروستکات. ئەگەرچی ڕوون وئاشکرا دیار بوو بوو کە ئەو دووە چ لێکنەچوون ونامۆییەکیان لە نێواندا هەیەو، چەمکەکانی کڵێساو مەسیحیەتی هەڵگێڕدراو وزانست تا چەند لێك دوورن.**

**دواتر کە لێکنەچوویی ودووری کڵێسا وفەلسەفە ڕوونتر بەدەرکەوتن‌و، ناحەزانی تۆمای ئەکوینی وشوێنکەوتوانی زیاتر خەریکی زیندووکردنەوەی ئەو لێکدوورییە بوون‌و، کاردانەوەکانی ئەم فەلسەفە سکولاستییەو بیرمەندانی دەستی بە دەرکەوتن کرد.**

ئەو کات بیری فەلسەفی دەستی بەوە کرد ئاڕاستەیەکی دونیایی ودوور لە لاهوت وئاینەوە بگرێتو، ئەمەش دوای شکستی مەسیحیەتی هەڵگێڕدراو بوو لەوەی کۆمەڵێك بنچینە وبیرۆکەی گونجاو لەگەڵ پێداویستییە تازەکان و واقیعی ئەوکاتی دونیا بە خەڵك ببەخشێ.

ئەو هەوڵانە بزاڤی سیکۆلاری "Secular Humanism"یان هێنایە سەر کاسە. عەلمانیەتیش وەکو مانا بریتییە لە دیدێکی دونیایی ودابڕاو لە ژیانی دواڕۆژەوەو، بزاڤێکە هەوڵی جێگیرکردنی دید وڕوانینێکی ئاژەڵ وجاهیلیانە لە نێو مرۆڤەکاندا دەداتو، کار بۆ ئەوە ئەکات دید وڕوانینیان لە ژیاندا دیدێکی تەواو دونیایی وجودا لە ژیانی دواڕۆژ وئاخیرەتەوە بێت. ئەم بیرۆکەیە لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا تەواو پێشوازی لێکراو زۆربەی شوێنکەوتوانی خەڵکانی بێ دینن وبڕوایان بە هیچ جۆرە ئاینێك نییە.

دواتر ئەم بزاڤە لە دیدی ژیانەوە بەرەو فەلەسەفەی فیکر ودواتر بەرەو سیاسەت وئەدەبەوە باڵی کێشا، وبەردەوام هەوڵی داوە چەمکی ئاینیی وابەستەی ئاخیرەت وژیانی دواڕۆژ؛ لە چەمك ودیدی دونیاییەوە جیاکاتەوەو، پێی گرنگ نەبووە کە ئایا ئەو دیدە دواڕۆژانەیە مامەڵە کردنە یا فیکر وسیاسەت وڕەفتار وهەر شتێکی ترە.

ئەم بزاڤە بە پلەی یەکەم تیشك دەخاتە سەر ئازادی تاکەکەسی لە هەڵبژاردن وکاروباردا، وپێی وایە عەقڵ بۆ ئەوە دروست کراوە شتەکان هەڵبژێرێت، نەك بۆ ئەوەی حوکم بکرێ. سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم بزاڤە لە ئەوروپا لە ئیتاڵیاوە بووە، دواتر تەواوی ئەوروپای گرتەوە وپاشان پەڕییەوە بەرەو ئەمریکا.

یەکەم کەسێکیش کە ئەم بیرۆکەیەی ئاوێتەی سیاسەت کرد "نیکو میکیا ڤیلی" ئیتاڵی بوو لە کتێبێکدا بە ناوی "پاشا – الأمیر". لەم کتێبەدا میکیا ڤیلی ئامۆژگاری پیاوی دەسەڵاتدار دەکات لە هەر جێگا ومەوقیعیەتێك بێ - ئەگەر مەبەستی جێگیر کردن ومانەوەی دەسەڵاتەکەی بێتن - پشت لە ڕەوشت وبنەما مەسیحی ومەعریفییەکان بکاتو، دەست بە بەرژەوەندییە مادی ودونیاییەکانییەوە بگرێت وهەڵسووڕاوی ئەو بەرژەوەندیانە بێ.

ئەمەش پەیڕەوی باوی ئەمڕۆی جیهانی سیاسەت ومامەڵەی زۆربەی دەوڵەتانەو، لە ژێر چەتری ئەم بانگەوازەدا هەر چی ئەخلاق وبەها ومافی مرۆڤ هەیە دەپووکێنرێنەوە. ئەو مافانەی بوونەتە جەمسەری هەر تەماحکارییەك بەرامبەر بە مرۆڤانی لاوازدا.

دواتر ئەو موسوڵمانانەی لە پەروەردەیەکی ڕۆژئاواییدا پێگەیشتبوون، وبە مانەوەیان لە ڕۆژئاوادا یا لە ڕێگەی خوێندن وهاوسەرگیرییەوە؛ نەزانانە وبێ تێڕامانەوە کاریگەری ئەم بیرەیان کەوتبووە سەر، هاوکات سەرسامییەکی بە دەستکەوتەکانی ڕۆژئاوادا لەگەڵ بوو، ئەم بنەمایانە لە دەروونیاندا تەواو جێگیر بوون وڕەگیان داکوتا، وبە دەر لە هەست کردنەوە پەیوەستەیەك لە نێوان شارستانییەتی پیشەسازی ڕۆژئاواو عەلمانیەت لە دڵ ودەروونیاندا قەراری گرت.

بەڵام ئاگاداری ئەوە نەبوون کە ئیسلام دینی خوای پارێزراوەو خوای پەروەردگار بە جۆرێك داینەوە وپارێزگاری لێکردووە؛ بۆ هەموو خەڵك ولە هەموو بار وزەرفێکدا بگونجێت. ئەوەیان لە یاد دا نەبووە کە ئیسلام بیرۆکەیەکی دەستکرد نییە بۆ ڕۆژێك بگونجێت ولەگەڵ ڕۆژێکی ترا نەسازێت، یا بۆ کەسێك بگونجێت وبۆ کەسێکی دیکە بار

**نەیەت، ئا بەم شێوەیە بێ ئەوەی لە بنچینەو ژێرخانی عەلمانیەت حاڵی بن؛ کەوتنە لاسایی کردنەوەی عەلمانیەت وئاگایان لە شەریعەت ودینەکەی خۆیان نەماو، ڕوویان لێ وەرگێڕا.**

**بۆیە بە نەزانی وگوم بوونێکی فیکری وتەسلیم بوونێکی ئاژەڵانەی عەقڵەوە، دەستیان کردە بانگەشە کردن بۆ ئازادی وبانگەوازی عەلمانیەت وگوزەران لە ڕێنموونی وبەها ئیسلامییەکانەوە.**

**لەبەر ئەوەش شارستانییەتی سیکولاری ڕۆژئاوا نەرم ونیانتر بوو لە عەلمانیەتە عەرەبییە ڕۆژهەڵاتییەکە، چونکە عەرەبە سیکولارەکان ئەو پەیوەستەیەی پێشووی عەلمانیەت وشارستانییەتی پیشەسازی ڕۆژئاوایان هەر لە بەر چاو مابوو، بۆیە وای کردبوو زیادەڕەوی لە ڕۆچوونی ئەو خەڵکەدا لە ڕەوشت وبەها ورۆژئاواییەکانەوە ڕوو بدات، وزیاتر لە دین دوورکەونەوە. بانگەوازی عەلمانییە ڕۆژهەڵاتییەکان زیاتر بانگەشەیەك بۆ لاسایی کردنەوەی ڕۆژئاوا لە ڕەوشتدا بوو، زیاتر لەوەی بانگەوازێك بۆ شوێنکەوتنی ڕۆژئاوا لە پێشکەوتن وپێشڕەفتەیی تەکنەلۆجی وپیشەسازییان بێ.**

**بۆ ئەوەی بگەنە ئامانجەکانیشیان، ئامادە بوون سەر لە هەموو کون ودەروازەیەکدا بنێنەوەو، دەروازەی گەورەیان چەواشەکاری وشێواندنی ڕاستییەکان بوو، بۆیە بانگەوازەکەیان زوو بڵاو بووەو زووش دەسووێتەوە، چونکە چەواشەکاری وەك پووڵی ساختە وایە، قازانجێکی زۆری هەیە، بەڵام زۆریش بە مەترسییە، چونکە خاوەنی ئەو پووڵە ساختەیە هەر ڕۆژێکی بەسە دەڕووخێت وبێ بازاڕ دەمێنێتەوە.**

بانگەوازی عەلمانییەکان بریقەدارە، بەڵام تیشکەکەی هەر وەك تراوکەی سەحرایەك وایە، بانگی ڕزگاربوونی ئوممەت ودەرهێنانی لە چاڵاوی ئەمڕۆی دەکەن، بەڵام جگە لە وشە جوان وڕازاوەکانەوە بەشێکی تریان لەو بانگەوازەدا نییە !

"ڕافیعی" لە باسی ئەو خەڵکەدا ڕاستی فەرمووە: "ئەوان دەڵێن؛ ئێمە بەو گوفتارانەی دەیڵێین ئوممەت وبەرژەوەندی وسەربەرزی ئوممەتمان گەرەکە، تا ئەو جێیەی توانای زمانزانی و زۆر بڵێیشیان پێی بگا دەنگ هەڵدەبڕن، بەڵام ئەوەندەیە پەردەکان هەڵدەیتەوە وبە دواداچوونێ بکەیت؛ تەنها خودی خۆیان ومەبەست وئارەزووەکانیان دەدۆزیتەوە، ئەو ئارەزووانەی دەیانەوێ دین وئەخلاق وزمانی خەڵکی پێ بگەیەننە سەر لێواری فەوتانەوە، وەکو خاوەن نەخۆشی "سیل" کە تەوقەت لەگەڵ دەکات وسڵاو وڕێزی خۆیتی پێ دەگەینێ، کەچی هەر نەخۆشی وئامرەزەکانی مردن وفەوتانیت پێ دەگا" !

ئاوا بەم شێوەیە عەلمانیەکان بە دەم بانگەوازی ئازادییەوە دەنگیان لە وڵاتاندا بەرز کردەوەو، خودی بانگەشەی ئازادیش ئەگەر چی ناوەکەی گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێ، بانگەشەیەکی جاهیلییانەی کۆنەو لە پێشدا قەومەکەی پێغەمبەر شوعەیب علیه الصلاة والسلام ونەفامەکانی قورەیش هەمان ئەو داواکارییەیان هەبووە، بۆیە هەڵگر وبانگخوازانی ئەم بیرۆکەیە بەردەوام سەریان لە کونەو دەگەڕێن دەیانەوێ لە هەموو حوکمێکی شەرعیدا حیکمەت وتەفسیرێکی دیار بدۆزنەوەو وهەموو عەقڵێك لێی بگاو، کاریان بەوەدا نییە ئاستی تێگەیشتن وحاڵی بوونی ئەو عەقڵە چەندەو لە چ ئاستێکدایە، ئەگەر نا شەریعەت لە خاڵی تۆمەت وگومانە ! بەڵام ئەوەیان نایەتە بەرچاو کە ئەگەر حیکمەت وتەفسیری هەموو حوکمێکی شەرعی دیار وئاشکرا بوایەو، هەموو عەقڵێك بێ ئەوەی پێویستی بە ساتە بیرکردنەوەیەك بووبا قبووڵی کردایە، ئیتر مەگەر شێت

وگەمژەو بێ عەقڵ ئەگینا کەس دژایەتی شەرعی نەدەکرد، خودی تاقیکردنەوەو ئیبتیلا بوونیش هیچ مانایەکی نەدەما.

پێغەمبەر شوعەیب نەهی لە نەتەوەکەی کرد مامەڵە بە هەندێ شێوەو شێوازی بازرگانی بکەن، بەڵام ئەوان داوای ئازادییان لێ کرد وگوتیان: نوێژ ودینەکەت چ کاری بە بازرگانی وئابووری ئێمە داوە ! خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {قَالُوا يَا شُعَيْبُ أَصَلاتُكَ تَأْمُرُكَ أَنْ نَتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ} - وتیان: ئەی شوعەیب، ئەرێ نوێژەکەتە فەرمانت پێدەکا واز لەوە بێنین کە باب وباپیرانمان پەرستوویانن، یاخود لە ماڵ وسامانمان دا بەئارەزووی خۆمان چیمان بوێ بیکەین ؟!

ئیمامی قورتوبی دەفەرموێ: (زانایان دەڵێن؛ مانای [لە ماڵ وسامانمان دا بەئارەزووی خۆمان چیمان بوێ بیکەین] | واتە :- ئەگەر خۆمان لەسەری پێکبێین وهەر دوو لامان ڕازی بن؛ تۆ چ کارت بەوە داوە قەدەغەیکەی ! خۆ تۆ هێمن وژیریت. مەبەستیان ئەوەیە تۆ بە لای خۆتەوە خۆت بە هێمن وژیر ئەزانی).

ئیمام ئیبن جەریری تەبەری دەفەرموێ: یونس بۆی باس کردووم کە ابن وهب پێیانی فەرمووە؛ ابن زید لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا {قَالُوا يَا شُعَيْبُ أَصَلاتُكَ تَأْمُرُكَ أَنْ نَتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ} دەیفەرموو :- واتا پێمان خۆشبێ ئەیبڕین، پێمان خۆشبێ ئەیسووتێنین، حەز بکەین فڕێی دەدەین، شتەکە بە ئارەزووی خۆمانە.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی لە نەفامەکانی قورەیش کرد مامەڵە بە سوو وریبا بکەن .. لە وەڵامدا گوتیان: {إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا} –خۆ کڕین وفرۆشتن هەر وەك ریبا وایە .-

ابن کثیر دەفەرموێ: "[کڕین وفرۆشتن وەك ریبا وایە] واتا :- هەر لەو ئەچێت؛ خێرە ئەمە حەرام کراوەو ئەوەی تر حەلاڵە ؟! ئەوەش ڕەخنەگرتنیان بووە لە شەرعی خواو مەبەستیان ئەوە بووە کە ئەمەو ئەوە وەك یەکن، بەڵام ئەمە حەرام ئەکرێت وئەوەی تر بە حەلاڵی ئەمێنێتەوە". قسەکانی ابن کثیر دواییان هات.

بۆیە ئەرکی موسوڵمانان بە شێوەیەکی گشتی لە ڕوو بە ڕوو بوونەوەی ئەم فیکرە وکەسایەتییەکانی ئەوەیە:

١- خەڵك لەو فیکرە ئاگادارکەنەوەو ئەوەیان بۆ دەرخەن ئەم فیکرە بە چ ئەندازەیەك دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکات، وتا چەند پێچەوانەی فیترەت وسروشتی دروستی مرۆڤە.

٢- هۆشیارکردنەوەی خەڵك وئاشکراکردنی کەسایەتی وبیرمەندەکانی ئەم فیکرە، بۆ ئەوەی خەڵك لێیان بە ئاگا بن وحەزەریان لێ بگرن.

هەڵگرانی عەلمانیەتیش یەك ڕێچکەو ڕێباز نین، بەڵکو چەندین لق وپۆپ وبانگەواز وبیری جیایان هەیە. ئەوەندەی ئاگاداری نووسینەکانیشیان بووبم وبابەتەکانیانم خوێندبێتەوە، تا ئێستا ئەسڵ وبنەمایەکیانم نەبینیوە ڕەهاو کەلەنی هەڵوەشانەوەو کەوتنەوەی نەبێتو، ئەگەر دەرفەت بوایە قسەی زیاترم لەو بارەوە دەکرد، چون بە ڕاستی جێگەی بایەخ وبابەتێکی گرنگە.